- ناوی کتێب: ناڵەی بەفرو پشکۆی ئاگر
- هیوا سەعید
- بابەت: کۆمەڵە شیعری 2005 ـ 2006
- تیراژ: 1000 دانە
- دیزاینی بەرگ: ئاگری
- شوێنی چاپ: چاپخانەی سیما ـ سلێمانی
- ساڵی چاپ: 2007
- لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان

ژمارەی سپاردنی(26)ی ساڵی 2007 دراوەتێ .

کتێبفرۆشی سۆران

TEL: 2231420
soranbook@yahoo.com
هەولێر ـ بازاڕی کتێبفرۆشان ـ نزیک داد

بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران
زنجیرەی ژمارە (76)

ئەم کتێبە دیارییکە ...،
پێشکەشە بە خوێنەرانی ئازیزی زمان و نووسینی کوردی
بە پێکەنینەوەش دەڵێم: پێشکەشیشە
بەهاوڕێی هەردەم لەگەڵ بووم "خەم".

هیوا سەعید 2007

# ڕۆڵەکانم لەبیر مەکەن

(1)

ڕۆڵەکانم لەبیر مەکەن
ئێمە کوردین، کوردستانین
جۆبارێکین لەمێژووی خوێن،
هەرچەند دژی خوێنستانین

لەباکوورمان، لەباشوورمان،
لەڕۆژ هەلآت، لەڕۆژ ئاوا
بۆ ئازادی، چەپك چەپك
خونچە گوڵمان هەڵوەراوە.

***

(2)

ڕۆڵەکانم لەبیر مەکەن
نیشتیمانێك كوردستانە
لەکەوشەنڕا بۆن سۆی لێ دێ .. #
بست بەبستی گۆڕستانە ..!

بە سووری خوێن، سپی ئاشتی،
سەوزی بەهار، بەزەردی ڕۆژ
ئاڵای تێدا نەخشێنراوە
بۆ گشت ئێوەی نەوەی دواڕۆژ

ئێوەش کاتێ کەگەورەبوون
شەهیدانمان لەبیرمەکەن ..
لادێ سووتان، کۆرپەی کوژراو
لەدایکانمان لەبیرمەکەن ..

6

به یەکێتی لەمپەرێك بن،
لەبەردەمی ڕەقیبی کورد
کورد زمانی قەڵغانتان بێ
بۆ تورك و فرس، تەعریبی کورد.
***

(3)

کەگەورە بوون، ئاوی شیرین
شێلوو مەکەن لەکانی یەکان
ئاگاداربن، گابەردەکان
هەڵمەدێرن لەچیاکان

چونکە کاتێك، کە کوردستان
ئێرەو ئەوێی جێی شەڕگەبوون
کانی و گابەرد بۆ بەرگری
وەك پێشمەرگە پێشمەرگەبوون.

***

(4)

ڕۆڵەکانم شتێك ماوە

پێتان بڵێم: لەبیرمەکەن

کە نەورۆز هات، لەپێدەشت و

ترۆپکەکان ئاگر هەڵکەن

تا جەژنی کورد،

لەناو جەژنی گەلانی تر بشنێتەوە

تا ناوی کورد،

لەناو ناوی گەلانی تر نەسڕێتەوە.

**10-1-2006**
**Hewler**

---

# کەوشەن: سنوور.

# دایکی ون

## ( هاواری منداڵێکی بێ دایکە )

لەناو لانکی
وەرزی سپیمدا بۆ"لایەلایە"
ئەسرین دەڕێژم،
کەسێ پێم ناڵێ کۆرپەکەی دایە.

دەنگێ نابیستم بانگم کا بڵێ:
"جگەر گۆشەکەم".
لەناو تەمەنی
دایك ونیمدا تاڵی نۆشەکەم.

پەپوولەم ونە،
لەناو بەهاری تازە گوڵیمدا
ئەستێرەم ونە،
لەناو ئاسمانی شەونخوونیمدا

بەسەرهاتی من، بۆتە بێ نازی و تەنیا مانەوە
بۆتە گریانێك كەسێ شك نابەم بۆ دڵدانەوە

دایەپێم بڵێ: چیت جێهێڵاوە بۆ من یادگار بێ؟
كام زەمین ماچكەم،
جێ پێی هەنگاوی تۆی لێوە دیار بێ؟

ئاوێنەك نییە، ڕەنگ و ڕووخساری تۆ هەڵداتەوە
شانەیەك نییە، تاڵەمووی قژی تۆم بداتەوە.

**20-5-2006**
**Hewler**

# چاوم مەیلی

# گریان دەکا

کەخۆرەتاو ئاوا دەبێ ئاسمان ناخی پڕ شەو دەکا
چاوم مەیلی گریان دەکا.
کەتاریکی چاو هەڵدێنێ چاوی ئاشق بێ خەو دەکا
دڵم ڕوو لەسووتان دەکا.

***

کەباخ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بەهار ڕوو لەنەمان دەکا
چاوم مەیلی گریان دەکا.
کەگوڵ پەڕەی لێ هەڵوەری سکاڵا لەخەزان دەکا
دڵم ڕوو لەسووتان دەکا.

کەخاك بەفری لێ دەکەوێ گوڵ ناوێرێ سەری دەرکا
چاوم مەیلی گریان دەکا.
کەدڵ ڕەنجی کێشا بۆ دڵ لێناگەڕێن بەری دەرکا
دڵم ڕوو لەسووتان دەکا.

***

کەئاشقێ ناکام دەبێ "ئاخ لەدەستی قەدەر دەکا"
چاوم مەیلی گریان دەکا.
کەخەم دڵێ داگیر دەکا ڕۆح ملکەچی سەفەر دەکا
دڵم ڕوو لەسووتان دەکا.

**5-8-2005**
**Hewler**

## لەخۆبایی

## مەبە هێندە ..

ڕۆژێ دادێ، تۆش وەکوو من
دڵت لەژێر پێی خەم ڕاخەی
لەتەماشای هیچ خەمۆکێ
وەڕس نەبی، چاو دانەخەی

گوێی بۆ بگری..،
لەئازاری کەخەم بەسەری دەهێنێ
بەسەرهاتی
وات لێ بکا، چاوەکانت بگرێنێ.

***

لەخۆبایی مەبە هێندە..،

شادی ماڵی هیچ کەس نییە

کەخەمت بوو،

لەبۆ چارەی

ئەوسا مردنیش بەس نییە

بۆچی دووری لەو کەسانەی

کەوا خەفەت یەخەی گرتوون؟

چبکەن ئەوان بێ گوناهن

قەدەر خۆشی لێ ستاندوون!

گەر تۆش وەك وان،

وا ئاسمانی حەزەکانت دیلی تەم بێ

پەنا دەبەی بۆ بەر یەکێ

کەوا گۆشەگیری کەم بێ

دوور مەکەوە ..

دوور مەکەوە ..

گەر ئەو نەبێ، گەر ئەم نەبێ

کێ باوەشی بێ نەواکا ؟

شادی تۆراو بۆ کوێ بچێ ؟

ڕووی لەلای کام دڵنەواکا ؟

**23-2-2005**
**Hewler**

# بۆ کیـژۆڵان

گوڵ هەر چۆن بێ ناوی گوڵە
کەگوڵیش بوو،
بۆنێك دەدا
گران و هەرزان گرنگ نییە
کڕیاری خۆی هەر پێی دەدا.

**11-3-2006**
**Hewler**

**16**

## وەرە مەڕۆ..

گەر تۆ بڕۆی جێم بهێڵێ
ئەوسا من، دڵ بەچی خۆشکەم؟
لەپەرداخەی دەستی کام دڵ
شیلەی خۆشەویستی نۆشکەم؟

کاتی بەیان،
لەڕووخساری کام خۆرەتاو ڕابمێنم؟
ئێوارەکان دوور لەدەنگت
زمانی کام گوڵ بەدەنگ بێنم؟

وەرە مەڕۆ..،
خۆت لەچاوی ئەم سەفەرە بەدوور بگرە
بانەکەویێ، دەست بەبەژن و
باڵای گوڵی ڕوو سوور بگرە.

**17**

***

وەرە مەڕۆ..،

توخوا ئازیز کانی ژینم شێلوو مەکە

بۆ ووشکبوون وەکو پایز

درەختی رۆح تینوو مەکە

تۆ نازانی،

دڵی ناکام لەتەنیایی چۆن دەناڵی

وەك باڵندەی ژێر بارانا

چۆن دەلەرزێ لەبێ حاڵی!

وەرە مەڕۆ..،

خۆت لەچاوی ئەم سەفەرە بەدوور بگرە

بانەکەوێ، دەست بەبەژن و

باڵای گوڵی ڕوو سوور بگرە.

**11-6-2005**
**Hewler**

## دڵێکی شکاو

بەم بڕیارەی
کەتۆ دات بۆ جێ هێڵاْنم دڵم شکا..،
فرمێسکم ڕشت..،
بەفرمێسکم
چاوی خەفەت تینووی شکا.
***

دەستی ساردی

ئەم بڕیارە لەناکاوەت

شووشەی دڵمی ورد و خاش کرد،

ژینمی شێواند..

پەردەی لادا لەڕووی پایز

گوڵی هیوای

نەپشکووای لێم هەڵوەراند.

***

ئەم بڕیارە،

نامەی خەونی نەهاتە دی

پێ گەیاندم

دامیە دەستی بێ ئارامی،

نامیە ژێر پێی بێ ئاکامی،

لەهەڵسانا کەواندمی،

لەناو گەرمەی پێکەنینا

گەرووی گرتم گریاندمی.

***

ئەم بڕیارە لەناکاوەت

فووی لەمۆمی جوانی کردم،

لەئامێزی لاویەتیما

دەریهێنام پیری کردم

لەجەستەما بوو بەبرین،

بوو بەگریان،

لەبن پاڵی ئەم شەوانەی

لانەویران تێیدا دەگرین.

***

بەم بڕیارە دڵم شکا..،

فرمێسکم ڕشت..،

بەفرمێسکم

چاوی خەفەت تینووی شکا

ئەوەی من بووم باڵندەك بووم،

بەدەستی تۆ باڵم شکا.

**Hewler-2005**

## لاپەڕەی یاداشت

ڕۆژانی زوو،
لەسەرەتای لاویەتیما
لەدەروازەی
ئەڤینداری و سەرشێتیما:

گوڵێکی ئاڵ، ڕوومەت بەخاڵ
بۆ چاو خەون، بۆ سەر خەیاڵ
بۆنکردنی ئاواتم بوو،
خاك و ئاڵا و وڵاتم بوو!

بەلاّم .. سەد ئاخ ..،

چبکەم دەستەی خەتاکەران!

لەپڕێکا پێکایان و هەڵیانوەران

ئەوەی ئێستاش پێی دەناڵم

لەسەر دڵم وەك گرێ یە

بۆن نەکردنی ئەو گوڵەیە

کە، تا مردن چاوم لێ یە.

14-2-2006
Hewler

## نـالّيـن

ئەی گوڵ چرۆی شەونم نەناس
ئەمشەویش وەك هەموو شەوێ
لەدووریتا،
گوڵی گریان لەچاوانما دەپشكووێ

دەگرییێم و لەگەڵ دڵی بریندارما
دەكولێمەوە..
دەسووتێم و لەگەڵ مۆمی
ژووری تارما دەتوێمەوە..

كەسێ نییە وەكوو من بێ، گریانی من،
شێوەی كەمە !
سووتانی من، زۆر نامۆیە
لەناو سووتانی سەردەما !

**24**

***

وێنەی نالەی ئەمشەو بۆ تۆ

ئەگەر کەوتە دەستی سبەی

تەنیا هەر خۆت خاوەنی بە

من دەمەوێ هەر خۆت بیبەی

تا ون نەبێ نالینی من،

لەئەلبوّمی دلداریتا

شەونخوونیم،

لەیاد نەچێ، لەلاپەڕەی یادگاریتا

نەکەی دووربی،

لەدیوانی لەیل و زینی پڕ لەزاما

چون خۆم دوورنیم،

لەگریانی مەجنون و مەم لەناکاما.

Hewler-2005

# سکاڵای دڵدارێکی ناکام

کە دەتزانی،
من لەدوای تۆ، قەد لەدەرگای دلأن نادەم،
وەك پەپوولەی باڵ شکاو وام،
بە بەهاری گولأن ناگەم

بۆ..جێتهێشتم ؟
لە پای دلێك، کە هەرگیز پەی پێ نەبردووی
لە شەوانی خەم بێ ئاگا و
گریە و ناڵەی بۆ نەکردووی؟

بۆچی هێشتت!
وا ناکام و گرفتاربم خۆشەویستم؟
کە دەتزانی،
من لەدوای تۆ، کەسێکی تر ناپەرستم!

که دەتزانی،
من لەدوای تۆ، بیٚ خەم نابم ساتەوەختیٚ
بۆ سرەوتن پەنا نابەم
بۆ سێبەری هیچ درەختیٚ

بۆ..جێتهێشتم ؟
لەبیابانی ژێر بڵێسەی خۆرە تاوا
بۆ خۆڵەمێش دوا یادگاری
سووتانم بیٚ لەئێستاوە؟

بۆچی هێشتت!
وا ناکام و گرفتاربم خۆشەویستم؟
که دەتزانی،
من لەدوای تۆ، کەسێکی تر ناپەرستم!

**13-9-2005**
**Hewler**

## شێتی

لەکاتێکدا کەدەزانم
"بریـا"تا سەر بێ بەرهەمە
کەچی دەیکەم!
دڵنیاشم
هـەتـا مــردن بـە دڵ هەمە!

25-8-2005
Hewler

## چەند دەمەوێ..

چەند دەمەوێ،
کەئەم وەرزە بێ بەهارەم لێ بەسەرچێ،
خەون و خۆزگەی نەهاتە دیم
کۆتایی بێ ولەیاد بچێ

بەلاّم .. چبکەم!
کوا دەسەلاّت! کەنەتوانم، کەبۆم نەکرێ.
درەختێ بم، جارێکی تر
لقم لەنوێ گەلاّ بگرێ؟

ئەی خەمی خۆزگە نەهاتووە دییەکەم
یەخەکەم بەردە
تاکەی ئاوا
من بەدیار تۆ، بنالێنم ئا بەم دەردە؟

***

چەند دەمەوێ،

خۆم لە گۆشەی تاڵی ژینا جیاکەمەوە

لەپایزی ئیشقی یارە

دوور کەوتووەکەم دوورکەومەوە

بەڵام .. چبکەم!

کەئیشقی ئەو، ئاگرێکە لەگەڵمایە

بەهیچ ئاوێ ناکوژێتەوە!

دوایی نایە، لەدڵمایە

ئەی خەمی خۆزگە نەهاتووە دییەکەم

یەخەکەم بەردە

تاکەی ئاوا

من بەدیار تۆ، بنالێنم ئا بەم دەردە؟

**Hewler-2006**

**30**

## خـــــەم

لەخەمی دڵ چرۆی عومرم
کەوتۆتە ژێربارانی خەم
پیریش بەخەم خوێنی گەنجیم
دەخواتەوە بەهەموودەم

وەك ئەستێرە،

تاریکایی بەچاوانم وەنووساوە

هەموو ساتێك،

((ترسی مردن

چرای لەڕووم داگیرساوە))

دڵبرینم ..،

برینیشم هەوێنێکە بۆ گریانم

ئاگرێکە لەسینەمدا

کڵپە دەدا بۆ سووتانم

هۆ ئاشقان سەرەمەرگەو هاواری من بۆ ئێوەیە

توخوا بڕۆن بەمەم بڵێن: مەمێـکی تر بەڕێوەیە.

**10-8-2006**
**Hewler-le roji Yadi le dayk bunim nusrawe.**

## دیاری

گەر هەر چ جارێ

بۆ گەشت یا بۆ کار

ڕێم کەوتبێتە خاکی هەر شارێ

بیرکەوتنەوەی تۆ، بانگی بۆ داوم -

دیاریت بۆ بێنم

بەڵام .. چۆن بێنم ؟!

گڵێنەی چاوی لەچاو ڕژاوم

که ئێستا دەستت فێرە دیاری
دەستێکی تر بێ!
هەستی جارانت، بەرانبەر بەمن
هەستێکی تر بێ!

بۆیە لەناچار، من هەموو جارێ
لەپای دیاریت گەلێ گریاوم
بۆ گەشت یا بۆ کار چووبمە هەر شارێ.

**2-2-2005**
**Hewler**

# قنیـات #

ئەو بەشەی هەمە پێی نا قایل نیم،
قنیات باشترە بەکونە کووخێ، #
نەك بەو تەلارەی بناغەی زبڵە
گەر ئەمڕۆش نەبێ، سبەی بڕووخێ.

**13-4-2005**
**Hewler**

---

# قنیات: قەناعەت

# کووخ: زنج: هۆدەیەك بەقوڕ و قامیش دروست کرابێ.

# لەپاشی تۆ

تۆ نازانی،
لەپاشی تۆ، چیم بەسەرهات
لەناو وەرزی
ونبوونی تۆ، من چیم لێهات

گەر لاپەڕەی ئەم ساتانەم هەڵدەیتەوە
لەهەموویاندا
تۆ ڕوو بەڕووی خەم دەبیەوە

لە پاشی تۆ،
تەم گەمارۆی کەناریان دام
تارماییەکان
لەناو خۆیان حەشاریان دام

بۆ هەر ڕێگەك هەنگاوم نا،

گەڕامەوە

بۆ هەر حەزێك چاوەنواڕبووم،

نووشتامەوە

* * *

وەك ئەستێرە، لەئاسمانی پڕ پەنهانی

تاریكایی..، لەخۆی لوولدام  هەتا توانی

هەموو شەوێك نامەی مەرگ و گرفتاری

وەك هەوری خەم بەسەر ڕوومدا دادەباری

وەك پەپوولە لەپایزی مەرگی دڵدا

لەزەمینی بیٚ بەهار و بەبیٚ گوڵدا

بەچەپۆكی خەزانەكان بیٚ ماچ كرام

لەناو بسكی ڕەشەباكان لەخاچ درام.

**20-2-2006**
**Hewler**

# تامەزرۆیی

ئازیز دونیا بوو گەر تووشمهاتی
لەهەر جێگایێ، لەهەر ڕێگایێ
سڵ مەکەوە لێم،
پێشکەشی ڕووم کە
نەرمە ئاوڕێ، شەرمە نیگایێ

دەستت هەڵبڕە لەزەینی کوێرم
وەك چۆن یەکەم جار دەستت هەڵبڕی
لێوت نەخش کە بەو جۆرە بزەی
کە تەفرەت دام و دڵمت پێ کڕی.
***

من، ئێستاش بۆ تۆ
هەر ئەو هۆنراوەم
دەکەوتە سەما لەگەڵ ئاوازت
هەستی ناسکی هەمان شاعیرم
دەبوو بەنشێو لەڕێی هەورازت

ئەو"لایە لایەم" هەر لەبیر ماوە
کە گڕووت دەگرت وەکو منالێ
بێیە باوەشم بۆتی ببێژم
تا هۆش و خەفتن لەیەك دەئاڵێ

بۆیە دونیا بوو گەر تووشمهاتی
لەهەر جێگایێ، لەهەر ڕێگایێ
سڵ مەکەوە لێم،
من هەر ئەو کەسەم
لەگوڵی بەژنت بۆنت دەدایێ.

**Hewler-nov-2005**

## خۆشەویستم

تاگوڵی سوورم
نەدا دەستت،
لەباخاندا بێ گوڵ تۆ بووی
تا نەبوومە خۆشەویستت
لەناخاندا بێ دڵ تۆ بووی

کەچی ئێستا نادیاری،
خۆت ونکردووە لەچاوانم
دوور کەوتنەوەت
کردۆتە گڕ، دەسووتێنی دڵ و گیانم.

خۆشەویستم:
لەناو وەرزی ونی ڕووتا دەرمبێنە

بگەڕێوه..،

وەکو جاران لەئامێزتا بملاوێنه

گەر سپێدەی ڕووی تۆ نەبێ

لەو تاریکییه دەکوژێمەوە

من له دووریت،

ئۆقره ناگرم، لەتەنیایی دەتوێمەوە.

***

خۆشەویستم:

من هەمیشه دیداری تۆ ئارەزوومه

بەدوای باڵات،

وەك ونبوویێك

لەشەقامان هاتووچوومه

بۆ هاتنەوەت,

هەمووساتێ چاوەنواڕی دەمخواتەوه

فرمێسکی خەم،

بەرەو مەرگی بێ کۆتایی دەمباتەوە.

***

گەر دەزانی،

ئاشق بوونم تاوانێکە بەڕووخسارت

نامەیەکم بۆ بنێرە،

تا نەمردووم لەئازارت

ژیان بێ تۆ

وەکو ناخی پڕ برین و پڕ هاوارە

وەك درەختی بێ گەڵایە،

بێ بەهاری لەڕووی دیارە.

16-4-2006
Hewler

## بەدبەختی

ئەوەی سەروەت چیێ نیمە
تەنیا دلێك لەخەم پیرە
کەچی هەردەم سەر و کەللەم
لەتەلبەندی خەیاڵ گیرە.

**3-10-2005**
**Hewler**

**43**

# پاش
## گوڵی سوور

ئەمشەو بە دیار مۆمێکی کز
پەڕی تەمەن دەخوێنمەوە
بەخەمەوە،
دەیان یادی تاڵی ژینم دەدوێنمەوە
ئەو ساتانەی بەتەنیایی
لە تاریکی بەسەرم برد
ئەو تەمەنەی
کەڕۆژانێ بە ناکامی تێپەڕم کرد
پاش گوڵی سوور،
پاش ئەو گوڵەی مرد لەژێر پێی هەڵوەریندا
پاش دڵی دوور،
پاش ئەو دڵـەی ناشتم لەناو ئێش و بریندا.

***

هیچ چرکەیەك من شك نابەم

تەمەن بێ خەم لێی ڕووابێ!

هیچ شوێنێ بەدی ناکەم

کەمێ خۆشی بەمن دابێ!

هەر شەقامێ لێم گوزەر کرد

لەڕووخساری خەمم دوواند!

هەر پەنایەك لێی دانیشتم

لەباوەشی فرمێسکم چاند!

پاش گوڵی سوور،

پاش ئەو گوڵەی مرد لەژێر پێی هەڵوەریندا

پاش دڵی دوور،

پاش ئەو دڵـەی ناشتم لەناو ئێش و بریندا.

3-9-2005
Hewler

## جیێگری !

شەو فرمێسکم
نەخشی کێشا لەڕووخسارم
چاوەنوارِبووم،
خەم لابەرم بێتە دیارم

کەچی نەهات،
لەجێگەی ئەو، شیعرێکی تر
لەخۆی گرتم،
تا ژوانی خەمێکی تر.

**12-9-2005**
**Hewler**

## ڕێم پێبدە ..

ڕێم پێبدە..، جارێکی تر
بۆ تەماشای ڕووت بێمەوە
تەمەن لای تۆ هەڵوەرێنم
هەتاکو سەر دەنێمەوە

ئاشقێکم چەندین ساڵە
ساتێ خۆشیم نەبینیوە..
نەهامەتی و خەمی دووریت
سەراپامیان داپۆشیوە..

جگە لەتۆ،
کەس ناتوانێ بۆ خەمی من دڵنەوابێ!
خۆرەتاوم تەنیا ئەتۆی،
کە تاریکیم پێ ئاوابێ!

***

ڕێم پێبدە...، جارێکی تر
شەپۆل بدەم بۆ کەنارتا
ڕێم پێبدە...، وەکو گوڵێك
بڕوێمەوە لە بەهارتا.

ئازیز جوانی هەر ئەڤینە،
مانا بەژین ببەخشێتن
با گشت خەڵکی پێیان وابێ
دێوانە و شەم کەوا شێتن.

جگە لەتۆ،
کەس ناتوانێ بۆ خەمی من دڵنەوابێ!
خۆرەتاوم تەنیا ئەتۆی،
کە تاریکیم پێ ئاوابێ!

**26-10-2005**
**Hewler**

## پێم مەڵێن

پێم مەڵێن: تاکەی بۆ خۆسووتانت
لەژێر هەتاوی ئەودا دەوەستی
تاکەی دەتەوێ گوڵی هەڵوەریو
بکەی بەڕووگە بۆ گوڵپەرستی!

چون من سەراپام بەستووی بەفرێکە
لەساردی ئەودا، جوێ نابێتەوە !
سەرما بردەڵەی تینووی هەتاوم
با گیانم تۆزێ گەرم بێتەوە

گوڵپەرستێك بم، لەودیو هەبوونیش
پەپوولانە بۆی گڕوو گاڵەم بێ..
جا چ دەبێ گەر گوڵ هەڵوەریو بێ
پەپوولانەش بۆی ناڵە ناڵەم بێ؟

توخوا لێم گەڕێن، چیتر پێم مەڵێن:
خۆت مەسووتێنە، با بتوێمەوە !
با پەرستگای من، هەر باخی زەرد بێ
بۆ هەڵوەریوان بچەمێمەوە !

**Hewler-2005**

# دڵم مەلێکە

دڵم مەلێکە، هەردەم زاریتی -
بە کوڵ بۆ کۆرپەی حەزی لەناوچووی
بۆ ڕووی بینایی ڕەش داگەڕاوی،
بۆ باڵی شکاو، بۆ لانەی تێکچووی

لەزاری نابی، ژیر نابێتەوە..
بۆ دڵدانەوەی کەس گوێ ناگرێ!
برینی سەختی خنکاوی خوێنە
چاری ناچاری بەکەس ناکرێ!
***
ئەگەر گەڵای ڕووم زەرد و زەبوونە
کوشتەی وەرزێکم لەخەم ڕەخساوە
چاوم لە دەستی دڵێکە هەردەم
ئەویش مەلێکە باڵی شکاوە:

لەزاری نابی، ژیر نابێتەوە...,
بۆ دڵدانەوەی کەس گوێ ناگرێ!
برینی سەختی خنکاوی خوێنە
چاری ناچاری بەکەس ناکرێ!

**19-7-2005**
**Hewler**

* * *

لای ئەم و ئەو باسم بکەی، پێم پێکەنی، بڵێی شێتە
قەد پاشگەزنیم لەو بڕیارەی، کەتا مردن چاوم لێتە
گەر تۆ دڵت کۆیلەی دەرە، چبکەم کەوا من وانیمە؟!
هەردەم سەرم کۆیلەی دڵەدڵیش هەردەم هیوای پێتە.

* * *

## بەسی یە ئیتر

بەسی یە ئیتر، دەبا دووریت ببڕێتەوە
گەڕانەوەت ئەشکی چاوم بسڕێتەوە
گەلێك سووتام، بەهەناسەی خەم ڕۆژانێ
خاکی ئیشقم چۆڵە چەشنی بیابانێ

تۆ بڕوانە، وەرزی ژینم پڕ زریانە
لەدووری تۆ، میوانی دڵ بەس گریانە
چرای چاوم لەچاوەڕێت کووژایەوە
تۆش هەر دووری، ئەم دووریەت نەبڕایەوە؟!

بەسی یە ئیتر، دەبا دووریت ببڕێتەوە
گەڕانـەوەت ئەشـکی چـاوم بسڕێتەوە.
***

وەرەوە لام ..

تاقە گوڵ بە لەباخمدا

ئارامم کە ..،

زام بنێژە لەناخمدا

لەڕووخسارم تەمی خەفەت بتۆرێنە

لەئاسمانی تاریکی دڵ، خۆر بڕوێنە.

گەلاَیەکم،

خەزان مایەی ئازارمە..

لەتۆ زیاتر

بەکێ بڵێم: بەهارمە؟!

گەر تۆ نەبی، من کێم هەیە دڵیارم بی؟!

بۆ شەپۆلی خۆشەویستیم کەنارم بی؟

بەسی یە ئیتر، دەبا دووریت ببڕێتەوە

گەڕانـەوەت ئەشـکی چـاوم بسڕێتەوە.

Hewler-2006

# ڕەنگی ڕەش #

ئەگەر دونیا لاپەڕەك با
ڕەنگم تێیدا بەش بەش دەكرد
بۆ هەموویان بەشم دەدا
تەنیا ڕەشم بێ بەش دەكرد.

**25-3-2005**
**Hewler**

---

# بۆ ئەوەی ڕەخنە هەڵوێستم بەرنەداتەوە مەبەستم لەو جۆرە بیركردنەوەیەم بۆ ڕەنگی ڕەش تەنیا ئەوەیە،كە ڕەنگی ڕەش لای كوردەواری و زۆرینەی نەتەوەكان بە واتای خەم دێ بۆیە وام پیشانداوە و هیچی تر بەڵكو من خۆم بەپێچەوانەی ئەم بیركردنەوەیەم بەرانبەر بەمرۆڤە ڕەش پێستەكان.

# بۆ خانمێكی لەخۆبایی

سەیر نەبێ لەلات خانم
كە ڕوو تووشی گەردیش دەبی
پەلك داری بێ ڕەگ نییە،
كەچی ڕۆژێك زەردیش دەبی

ئاسمان هەردەم یەك كەش نییە،
كە ساماڵ بوو، هەوریش دەبی
((جوانیش تا سەر بۆ كەس نییە))،
كە گەنجی بوو، پیریش دەبی.

19-10-2006
Hewler

## مەڵێ .. چبکەم!

مەڵێ .. چبکەم!
کەوا هاژەی ڕووباری خەم کاست دەکا
بۆ نەمانت،
چبکەم کەخەم
لەلای مردن باست دەکا!

ئاخر گوڵم:
خەم لەتۆوە بەرەو لای من هەنگاو دەنێ،
فوو لەچرای ناخم دەکا،
هیوای ژینم لێ ڕاودەنێ.

***

هەرچەند دەکەم..

لەبەر خەمت،

ئازار لەمن زویر نابێ

بۆ ساتێکیش ڕەنگی شادی

لەڕووخسارما جێگیر نابێ!

کە چاوانم لێك دەنێم شەو

تەنیا بەخەم خەو دەبینم!

کە چاوانیش هەڵدێنم رۆژ

لەخەم زیاتــر هیچ نابینم!

**24-1-2006**
**Hewler**

# گلەیی

من گلەیی ناکەم لەوەی
کەچەندین ساڵ لەبێ تۆیی
وەك (با) تەمەن،
گەنجی و جوانیم،
بەشەوگاری خەمدا ڕۆیی

بەس گلەیی ئەوەم لێتە
شیرینەکەم،
گیانی گیانان،
بۆچی هێشتت من وابمە
لۆمەی بن و سەری زمانان؟

**2-8-2005**
**Hewler**

## گوڵی ژاکاو

خۆ دەزانم، ئێستا زەردە

باخچەی سەوزی دڵداریمان

هێندەی ڕووی تۆ

ووشك و خاوە

تابلۆی یاد و یاگاریمان

بەڵام منێك،
كە ڕوژانێك
دڕكی دەورەم هەڵكەنیوی
لەگەڵ تۆدا خەمم خواردووە،
لەگەڵ مندا پێكەنیوی

چۆن شایانی ئەوە دەبم
بە كەنارما تێپەڕ بكەی
نەمپرسیت و نەمدوێنی،
خۆت وا لاڵ و وا كەڕ بكەی؟!

Hewler-2005

# ئازیـــــزان

ئەی ئازیزان:
گەلێ سەختە لەباوەشی تەنیاییدا
لەغەریبی، دوور لەئێوە،
لەگەڵ ناڵەی جوودابیدا

ئاوێتەبوون لەگەڵ ژینی
بێ ئێوەدا بێ مانایە
پڕ لە وەرزی هەڵوەرینە،
بەهارێکی لێ هەڵنایە.

***

لەدووریتان، خەم لەمندا دەریایەکی بەبێ بنە

بالآم نوقمی چۆڵەوانی ئاسمانیشم لە تەم ونە

وەك  دێوانەی رێ لێ ونبوو

پەشۆکاوی قووتی داوم،

تاسەبار و گرفتارم، لەبێ دەنگی خۆم ڕاماوم

شەو نییە، بۆتان بێدار نەبم

وێنەکانتان نەمسووتێنن

ڕۆژ نییە، لێرە بیرتان نەکەم

یادەکانتان نەمگرێنن

ئەم دوورییە بۆتە دەردێ بەرەو ئێشم دەکاتەوە

بۆتە برینێ لە سینەمدا خوێنی دلّم دەخواتەوە.

**20-nov-2005**
**Baghdad**

**64**

# نێـــرگز #

نێرگز ـ گوڵی

یەخەی وەرزی سەوز و دوور لەژینم

کاتێ ـ

لەئاوێنەی خەیاڵمدا تۆ دەبینم

بە دڵ ـ بۆنت دەکەم،

پرچی نەرمت دادەهێنم

بە چاو ـ لەڕووخساری

پڕ بەهارت ڕادەمێنم

دەڵێم: ئاخۆ

کەی دەمگەیتێ و کەی دەتگەمێ؟

تا بۆ دیاری ئازیزەکەم

وەکو جاران تۆی بدەمێ.

Baghdad-2005

# گوڵە نێرگز.

## شیعرەکانم

شیعرەکانم سەدای دەنگی هاوارێکمن،
ئازارێکمن،
لەپیشانی من ئاوسن،
پێلن بەرەو کەنارێکمن

گەر چاوی کەس تێیان نەگا
بیبیلەکەی چاوی ئەون
گەر زمانی کەس باسیان نەکا
هەردەم لەسەر زمانی ئەون.

***

شیعرەکانم،

تەیر و تواری کێویلەش بن

کەوی ئەون #

بۆ بەرزایی چەند هەڵکشێن

هێندەش ڕووەو زەوی ئەون.

**2-nov-2006**
**Hewler**

---

# کەوی: ماڵی.

## مەرگی یار

**لەدێڕێکدا دەڵێم: " ئەو کەس: سازی ژێ پساوە**
**لەهەست و سۆز دابڕاو بێ،**
**فەرامۆشی ئەو کەسە کا**
**ئێش بۆ ڕاوی هەر لەڕاو بێ".**

**تەنیا لەبەر ئەوەش بوو"مەرگی یار" م نووسی.**

ئەمجارەیان هەواڵی یار
دوا هەواڵی یەکجاریە
کۆچی سووری
بەرەو دووری
خاکی گوڵ و یادگارییە.

بارگەی پێچرای ئەم سەفەرەی تۆران نییە، دواییە
سەرنانەوەی لەناکاوە، جیابوونەوەی کۆتاییە.

توخوا وەرن، من بنێژن پێش ناشتنی ئەم ئازیزە
مانەوەی من، بێ مانایە لە پاشی ئەو, لەم پایزە.
***
ئەگەر دونیا بەبێ ئەو بێ چ ژینێکە..، چ مانێکە؟!
کام ئاسمانە، کام زەمینە، پەناگەی چ نالێنێکە؟!
ئاخر دوای ئەو،
زویربوون و ئاشت بوونەوەم لەگەڵ کێ بێ؟
من سکالاَ لای کێ بکەم؟
خەم و خۆشیم، تێکەڵ کێ بێ؟

توخوا وەرن، من بنێژن پێش ناشتنی ئەم ئازیزە
مانەوەی من، بێ مانایە لە پاشی ئەو، لەم پایزە.

**Hewler-2006**

## لەناو چـــــوون!

ئاگر و قین بارانمکەن..،
پەڕ و پیتم بسووتێنن
گەنجینەی من، هەرچی هەیە
گوڵی هەستمە، بیژاکێنن!



70

سەنگەر بگرن لەچنینم،
نەخشی چنراو هەڵوەشێنن
بابنی بێ خوێن و حوبر،
پەنجە و قەڵەم تێك بشکێنن!

قرچ و بڕبوون
هەر لەخۆم دێ!
درێخی مەکەن، چی دڵ نووسمە -
قرچ و بڕکەن ...،
ئاوێنەکم،
شەق و شکان چارەنووسمە.

**17-nov-2006**
**Hewler**

# تـازە ئیـتر ...،

دوو گڵێنەی ئەسرین خواردووین،
لەناو چاوی یەك گریانین
دوو فتیلەی ئاگر گرتووین،
لەژێر حوکمی یەك سووتانین
خۆمان نەبین
کێ دەبینێ ڕووی تینووە گوڵی ئێمە؟
خۆمان نەبین
کێ دەزانێ وێرانەیە دڵی ئێمە؟

تازە ئیتر..،
ئێمە هەردووك دەرگا لەڕوو داخراوین
سینەی ئێمە جێی حەسرەتە،
بۆ یەکتری هەتا ماوین.

***

لەئاسمانا دوو ئەستێرەین،
لەباوەشی تاریکدا
لەزەمینا دوو گوڵ خونچەین،
لەناو وەرزی هەڵوەریندا
لەخەمی یەك
تروسکایی ترازاوە لەڕووخسارمان
بۆ یەکتری
زەرد و کزی ئاڵۆزاوە لەبەهارمان.

تازە ئیتر..،
ئێمە هەردووك دەرگا لەڕوو داخراوین
سینەی ئێمە جێی حەسرەتە،
بۆ یەکتری هەتا ماوین.

**Hewler-2006**

# دڵنیامە

دڵنیامە .. دڵنیامە
کە لەزاری هۆنراوەما
دەنگی هەنیسکم دەبیستی
لەگەڵ چاوی وشەکانما
کۆڕی گریان دادەبەستی

ئەو ئازارەی لەخەمی تۆ
من دەیچێژم، تۆش دەیچێژی
ئەو گۆرانییەی بۆ دووری تۆ
من دەیبێژم، تۆش دەیبێژی.
***

دڵنیامه .. دڵنیامه
كه بەسەیری هۆنراوەما
ڕەنگی خەم و گریانی من،
لاپەڕەی ڕووت دەشێوێنێ
وەك لاپەڕەی بێ گیانی من

ئەو ئازارەی لەخەمی تۆ
من دەیچێژم، تۆش دەیچێژی
ئەو گۆرانییەی بۆ دووری تۆ
من دەیبێژم، تۆش دەیبێژی.

**Hewler-2005**

## سالآنێکه..

سالآنێکه..، زامەکانم بەئازارن

چاوەکانم

هەور ئاسا گریەبارن

دوور لە مەلی هیواکانم دەنالێنم

هۆنراوەی خەم،

لەهەناسەم دەئالێنم

بەبێ خەندە و پێکەنینە لێوەکانم..

بێ ئارامە دڵ،

لەداخی خەمەکانم..

لەوێرانی خاکی ئیشقی بێ بەهارم

ووشکانییە

ناخی تینووی پڕ هاوارم.

***

سالآنێكه..، لەو خەزانە بەبرینە

وەك درەختێ

گەلآی عومرم لەوەرینە..

تاریكایی شەو لەخۆیدا نوقم كردووم

ڕۆشنایی

بۆ ساتێكیش نادا لەڕووم

چاوێ نییە،

بیگرییێنی ڕووی پڕ تەمم

دڵێ نییە،

بیسووتێنێ پشكۆی خەمم

تەنیا و بێكەس

كووچە كووچە دەخولێمەوە..

بەسەرهاتی ناكامی خۆم دەڵێمەوە.

**22-4-2005**
**Hewler**

## خەون دیدەی

## خەوانی شەو

خەون دیدەی خەوانی شەو:
هەرچیت بینی پێم لەخەوتا
مەیدرکێنە لای ئەم و ئەو.

***

ئەوانەی تۆ

کەپێتوایە

شیکەرەوەی خەونی گەشتن

خەوننامەی خەونی تۆنین

بەختنامەی بەختی ڕەشتن

گەر بتوانن لە دەستیان دێ

خۆ هەر واشە بێ پێشبینی

لەخەویشدا ڕێت لێ بگرن،

تا خەونیشم پێ نەبینی!

**14-12-2006**
**Hewler**

# خەمت

چاو شۆڕی خەمی هەموو دونیا بم
چاو شۆڕی خەمت
نەبوویمە هیچ کات

چیم پێ نەدابێ
هەموو گریانێك
فرمێسکی گەشم کردووە بەخەڵات.

Hewler-2006

## ئەو گۆرانییەی

## بۆ ئاوێنەم گووت

هیچم نەدی..،
هەتا ژیام لەڕۆشنایی دابڕاو بووم
شەوگاری تار لێم نەبۆوە..،
من هەمیشە بێ هەتاو بووم

تەمەنم زوو بەرەو سەر چوو
کاروانی گەنج، جێمی هێلا..
لۆچی پیری و قژی سپیم
سەر و ڕووخسارمیان کێلا..

ئاهی حەسرەت هەڵدەکێشم
بۆ ئێستاکەم، بۆ ڕابردووم

بۆ ئەو ژینەی لەهەر شوێنی
خۆشی لێی با، من لێی نەبووم

تەنیا لەبەر ئەوەی
چبوو -
من ئاشق بووم .. من ئاشق بووم

کاسە ژاری دەستی گەلێك
خەمم نۆشی هەتا ئەمرۆ
بۆ هەر خەمێك
چاوەکانم
بەفرمێسك کەوتنە ڕۆ ڕۆ

دەمگووت: قەینا، هەر دێ خۆشی
ئاورِم لێ بداتەوە
دەستی گیرکا لەپەردەی خەم
لەسەر دڵم هەڵداتەوە

بەڵام .. کەچی قەد وانەبوو،

جارێك نەیبیست هاواری من،

سەری نەدا لە وڵاتی

سارد و بەبێ بەهاری من

تەنیا لەبەر ئەوەی

چبوو -

من ئاشق بووم .. من ئاشق بووم.

**18-5-2005**
**Hewler**

## بۆ ئـەنفـــــال

ئەگەر مێژووم
بەقیژەی ژن و
زیڕەی زارۆیان ڕازاوەیە ..!

ئەگەر کەلەپووری نیشتیمانم:
شا بسکی قووتکراوی
کیژۆلاًن و
کاسە سـەری دۆزراوەیە ..!

پێم شەرم نییە،
چونکە کوردم!
پێم شەرم نییە، چونکە بەمنداڵی
لەناو بازنەی ئەم جیهانە
لەکاتێکدا
ئەولام منداڵ..ئەولام منداڵ
تەنیا من بووم لەبن گوێچکەم
لەجیاتی (بانگ) #
هاواریان کرد ئەنفال..ئەنفال ! !

18-8-2006
Hewler

---

# بانگ دان: نەریتێکە لەبن گوێچکەی منداڵان.

# هیــوا

نیشتیمانم کۆرەش بکەن
هەر دەبینێ سبەی دەستی
تەل و سیمی چوار بەرەکی
پس پسی یەك بەرە بکا

نیشتیمانم کەڕیش بکەن
هەر دەبیستێ سبەی زمانی
حەپەی گوڕ و دێرە سەگی
دەورەی، چەغە هەرە بکا.

Hewler-2006

## سەگە ڕەش #

دە هەستنەوە .. جارێکی تر
دایکانی کورد، باوکانی کورد
جوامێران و
گەردن کێل و جوانانی کورد

دە هەستنەوە .. بۆ بینینی
سەگە ڕەشەی عۆجە و تکریت،
ئاوەگڵ و ژەهری مێژوو
مێژووی کوشتن ..!
قەپ لێدانی هێسك و بەدەن،
خوێنی گەورە و بچووك مژتن..!
***

دە هەستنەوە..،

وا ئەو سەگەی لە(هەڵەبجە)

زارۆی سووتاند بەلیکی دەم،

چەشنی کوورە

لەبیابانی (نوگرە سەلمان)

بەخوێنی کورد کەڵبەی سوورە

وا ئەمرۆکە

پەت بەمل وپەل بەستراوە

تا سەیری کەن..!!

تا چەندین جار پێتان حەپی یە

سەد ئەوەندە چەغەی لێ کەن.

30-12-2006
Hewler

---

# (سەگە ڕەش = سەدام) بۆ شەهیدان نووسراوە

لەکاتی لەسێدارەدانی سەدام .

# پێشمەرگە

لەتێکۆشانت ئەوە فێربووم

نەرمە خاك و

خاکی بەردین

هەرکام لەوان کوردستان بێ

خۆشم بووی و خۆشی بووێم

هەرکام لەوان

هەتیوانی لێ نشین بێ

بۆی دانەوێم..،

ببمە خۆری شەو شکێنیان

بەتاریکیان داهەڵگەرێم.

**12-6-2005**
**Hewler**

# شەهیـد

ژیان یەکێ مردوو ناکا
کە نیشتیمان هەناسەی بێ
ڕێبواری ڕێی ئازادی بێ
خەبات کردن پێناسەی بێ.

**11-7-2005**
**Hewler**

# چونکە کوردبووین

تا بستێکمان بەهەتاو کرد
دەیان دلۆپ خوێنمان ڕژا..
تا باخێکمان بەبەهار کرد
دەیان گوڵمان مەرگی پژا..#

تا منالێکمان بەلاو گەیاند
دەیان منالمان لێ لەبەرچوو..
تا لاوێکمان بەپیاو گەیاند
دەیان لاومان لێ لەناوچوو..

چونکە کوردبووین..چونکە کوردبووین!
***

تا گوندێکمان بوژاندەوە
دەیان گوندمان سووتێندرا..
تا لقێکمان ڕاستکردەوە
دەیان ڕەگمان هەڵکێشرا..

تا شەهێدێکمان لەگۆڕ ناشت
دەیا شەهید هەواڵی هات..
تا چاوێکمان ژێر کردەوە
دەیان چاومان گریانی هات.

چونکە کوردبووین..چونکە کوردبووین!

**6-nov-2006**
**Hewler**

---

# پژا: پشکووا.

## بۆ عەبدولهادی دەڕاجی

( شیعرنامە )

دەمامکت لەڕووش لانەدابا
خۆ هەر ئاشکرابوو،
تۆ شاگردی شیر وەشێن و
دەمی شیر دەم بەخەردەلی

تۆ دامەنی دشداشەکی
بەخوێن بووی براکەت و
شەڕ خوێنی هەمان شەڕگەی
(الفتنة وقع الجمل) ی #

***

ئاشکرابوو تۆ(هادی) نی،

چونکه (هادی)# ئەو کەسەیە:

پێت بڵێ سەگ

کە ناو چۆکت پڕ گووسەیە

لەبراگەلیت حاشابکا،

تا وەکو تۆ، واپیس نەبێ

لەناو دڕك و زەردەڵانتان

بۆ گەلی کورد گوڵ بچینێ

کە تاهەتا

بە(نا هادی) وەك جەنابت

نەخۆی نە گوڵ قەد سیس نەبێ.

***

پاشگەز بەوە لەوەی گوتت:
"کورد لای ئێمە هیچ ناهێنێ"
تۆ خۆت نیوەت کەوتۆتە بن ئالآو
ئەم چوار ڕەنگە تۆخەی

پاشگەز بەوە لەوەی خواردت:
"کەرکوك وەکو عەممارەیە"
تۆ خۆت ئێستا سووچێك نییە
پشتی پێدەی بلێی: ئۆخەی

ئەم شورەیە بەتۆ ناشکێ..،
ئەم کۆرپەت پێ بێ باب ناکرێ
ئەمجارەیان
بە(جامع المعاجم)ی زمانەکەشت
دڵنیابە..دڵنیابە،
کەرکوك هەرگیز ئیعراب ناکرێ.

***

ئەمجارەیان کورد لەکەرکوك جارِی لەدایك بوون دەدا
لەبناری بەژنی حەمرین تەرمی تەعریب گۆرِنێژ دەکا
بۆ ئەو لووتکەی ساڵەهایە بیّ ئاڵایە, ئاڵاّ دەبا
لەبەردەمی بابە گورِ گورِ بۆ (صلاە الفتح) نوێژ دەکا.

6-12-2006

Hewler

---

# (الفتنة وقع الجمل): ناونیشانی ئەو شەرِ و کوشتارەیە کە، لەپـــاش کوژرانی عوسمانی کورِی عەفان لەنێـــوان لایەنـگرانی عەلـی کـورِی تـالـــب و عــائیشەی خێزانی پێغەمبەر د.خ روویدا.

# (هادی): مەبەستم لەهـــــادی عەلەوییە، نووســـەرێکی عێـــراقییە حاشـــــای لەعەرەبایەتی خۆی کرد لەبەر هەڵەبجە.

## مافی مرۆڤـ

لەم جیهانە گەر دەستاڕێك
هیچ نەكا و بەس زمان ببزوێ
بۆ كوتانی جولەكەكان،
مافی مرۆڤـ بەئاگایە

بۆ كوردیش، كە ساڵەهایە..
بەچوار دەستاڕ وا دەكووترێ
مافی مرۆڤـ،
دەڵێی نووستووی بن گوێی گایە.

**Kirkuk**
**10-12-2006**

## بەرەو ڕوون

من دەمەوێ .. ئەمجارەیان
لەئاوێنەك سەیری خۆم کەم.
من وەکو خۆی پیشان بدا
تا باوەڕ بەبوونی خۆم کەم

تا بزانم، كە من هەم و..

بەبێ باڵا و بێ لانە نيم

لەو زەمينەی كە من تێيدام

بەبێ ئاڵا و بيگانە نيم

تا تێبگەم..،

تا پێبگەم لەو وڵاتەی كە وڵاتمە

ئەو ئاواتەم بۆ بێتە دی

كە دەمێكە، من ئاواتمە ـ

باڵندەك بم، لەئاسمانێ

كە هی خۆم بێ و هيچ نێتە ڕێم ـ

گەر ئارەزووی فڕينم كرد

ترسم نەبێ باڵ سوور بكرێم

ئەو سرووودەی كەپێناسەی

بوونم دەكا, ئەو بێتە گوێم

ئەو سنوورەی كەشايانی

بوونم دەكا، بەس لەو بدوێم.

***

من دەمەوێ .. ئەمجارەیان
لەئاوێنەك سەیری خۆم کەم.
من وەکو خۆی پێشان بدا
تا باوەڕ بەبوونی خۆم کەم:

هێند دەستخەرۆی گومان نەبم
لەبوونی خۆم یاخود من نیم
ئەو نهێنی یە ئاشکرا بێ
کە نازانم، من هەم یا نیم!

Hewler-2006

## ئێمە كوردین..

ئێمە كوردین..ئێمە كوردین
بەرگی خەبات داناكەنین..

باكوور، باشوور، ڕۆژهەلاّتمان،
ڕۆژئاوامان پێكڕا جوانە
شارمان، دێمان هەمووی دەنگی:
بژی كورد و كوردستانە..

نەخشە و ئالاّ، كورد زمانمان
شیرینترن لەگیانمان
دەشت و چیا، باخ و گوڵمان
بۆندارترن لەهەبوونمان.

***

ئێمە کوردین..ئێمە کوردین

بەرگی خەبات داناکەنین..

شانازییە پیشمەرگە بوون

بۆ ئازادی، بۆ سەربەخۆ

هیوای گەلە ژینی شادی

لەگشت لاوە بۆ تاك و کۆ.

ئاشتی پەیڕەی سەرکەوتن بێ

پێ هەڵدێنین تا سەرکەوتن

زانست هێمای پێشکەوتن بێ

هێمامانە، تا پێشکەوتن.

**12-2-2006**
**Hewler**

# بۆ شوانەی سەید قادر #

برام شوانە:
هۆ باڵندە باڵ سوورەکەی ڕۆژهەلاَتم
هۆ گولاَڵەی تازە هەڵچووی
خاك و خۆڵی مەهابادم

ئەو دلۆپەی
لەتۆ تکاو داچۆڕایە خوێناوی کورد
دلۆپێکی قەتیسە هەر،
ووشك نابێ لەچاوی کورد.
***

وانەزانی، کە تۆ مردووی

تۆ نەمری، تۆ نەمردووی

هاوارێکی..، تازە ڕابووی

لەناو دەمی کوردستانا

ئاگرێکی..، تازە هەڵبووی

بۆ سووتانی دوژمنانا

کپ نابیەوە..ناکوژێیتەوە..

هەرچی چیا و دەشتی تۆیە

بەپێوەیە ..،

بەرەو پیرت بەڕێوەیە، پشتی تۆیە

***

برام شوانە:

ئەوەی کە من بۆت دەنووسم

شیعر نییە خۆشەویستم

گریان نییە، چۆن بۆ "نەمر"

شین و شیوەن داببەستم؟!

مۆژدەجارە:

"ئەوەی خاكمان

لەخوێنی خۆ، دەگەوزێنی

لەچوار لاوە، بۆ خنكانمان

لافاوی سوور هەڵدەستێنیٚ"

خاترجەم بە،

نەورۆزێك دیٚ

لەتۆڵەی تۆ و سەدی دوێنیٚ

خوێناوی كورد ببێتە كاوەو

كورد خۆرەكان..، بخنكێنیٚ.

6-1-2006
Hewler

---

# ئەو جوامێرەی لەشاری مەهاباد شەهیدكرا.

# خاترجەم: دڵنیا.

## بەڵێـــن بێ

گەر ئەمجارە
ئاوێنەی دڵ تۆم پیشاندا، دەیشكێنم
ژوانی تۆ بەهەشتیش بێ
ڕێی بۆ نابڕم تابمێنم

بێ هۆشی بوو كە ڕۆژگارێ
بێباك لەخۆم بۆت دەسووتام
پەشیمانم لەوەی كردم،
شایان نەبووی بۆت دەگریام

گەلێ جاران
لەرێی تۆدا خونچەی حەزم لێ هەڵوەرا
خەزان هاتوو رێی پێ گرتم،
بەسەرتاپامدا هەڵگەڕا

تۆش هەر مەستی ویستی خۆتبووی
بەدەوریدا دەخولایتەوە
دەبوویە بەفری خۆرێکی تر،
بەتیشکی ئەو دەتوایەوە.

بەڵێن بێ،
بەڵێن بێ جارێکی تر بۆت نەسووتێم
بەڵێن بێ،
بەڵێن بێ جارێکی تر بۆت نەگرییێم.
***
ئێستا ئەگەر
دەست بەرداری ئەڤینتم  بێ خەتامە
باوەڕناکەم بەو نیگایەی
وا پیشاندەی لەدڵتامە
زۆر مەحاڵە.. جارێکی تر
بۆ دیدارت ئێشك بگرم

تۆ لەحاڵی من نەپرسی

منیش بۆ تۆ، بژی وبمرم!

***

دەڕۆم ئیتر،

تا دەگەومە تروسکایی هیواکانم

لانەی تاریك جێ دەهێڵم،

بۆ لاپەڕەی یادەکانم.

دەبێ ئیتر

شیلەی لێوی سپێدەکان بخۆمەوە

بەسەرهات وچیرۆکی دڵ

بەتیشکی خۆر بنووسمەوە.

بەڵێن بێ،

بەڵێن بێ جارێکی تر بۆت نەسووتێم

بەڵێن بێ،

بەڵێن بێ جارێکی تر بۆت نەگرییێم.

Koya-9-6-2006

## خەڵەتاو بووم..

خەڵەتاو بووم..، کە وامزانی
لەمن زیاتر نابی ڕازی
مێوانی تۆ،
گەر من نەبم
خۆت دوور دەگری لەپێشوازی.

**9-6-2006**
**Hewler**

## هەر دەبێ بگری!

هەر دەبێ بگری..،
بۆ ئەوەی تۆیان هەرزان فرۆش کرد
کاسەی کچینی پڕ ئارەزووتیان
بەتاڵ و بۆش کرد.

هەر دەبێ بگری..،
بۆ خامەی نەخش و پەڕی ژاکاوت
بۆ لێوی دوێنێ و بزەی فەوتاوت
بۆ ئەو گەنجینەی کە سەنگ بوو هەتبوو
بۆ ئەو جوانییەی لەڕووتا ڕەتبوو.

***

هەر دەبێ بگری..،

تەمەنی ماوت لەگریان پڕکەی

لەشت تێکەڵی وەرزی مردنکەی،

لەزریان سڕکەی.

یەخەی کەس مەگرە،

مەڵێ: ئەوانەی بەهەرزانیان دام

دڵیان چەپەڵ بوو،

قینی تێ زابوو،#

کەوتمە بەر ڕێژنەی مەرامی ڕەشیان

چونکە هەر خۆتبووی

هەموو کات و سات

لەهەڵکشین بووی بەرەو باوەشیان.

4-7-2006
Hewler

---

# قین: ڕق.

## بەسەرچوون

ئەگەر ئەڤین دەریاش بێ!
نە من ئەو پێڵە ماوم
نە تۆش ئەو کەنار ماوی #
ئەگەر ئەڤین باخیش بێ!
نە من ئەو گوڵە ماوم
نە تۆش ئەو بەهار ماوی.

**13-8-2006**
**Hewler**

---

# پێل: شەپۆل.

# بووك و زاوا

**( پیرۆزبایی )**

پیرۆزبێ ڕۆژی بەیەك شادبوونتان،
ڕۆژی ناسین و بەهاوسەر بوونتان
پیرۆزبێ لێتان، پیرۆزبێ لێتان،
داگیرساندنی مۆمی تەمەنتان.
* * *
پیرۆزبێ نامەی بەختی مێوانتان،
بەڵێنی ڕاست و پاكی نێوانتان
پیرۆزبێ لێتان، پیرۆزبێ لێتان،
ئەڵقەی زێڕینی پەنجەی زێڕینتان.
* * *
پیرۆزبێ لەبووك، پیرۆز لەزاوا
بەهاری تازەو بەگوڵ ڕازاوە.

* * *

پیرۆزبێ نیگای پڕنازی چاوتان،

ئەم بزە جوانەی وا لەسەر لێوتان

پیرۆزبێ لێتان، پیرۆزبێ لێتان،

بەزم و ئاهەنگی زاوا و بووکیتان.

* * *

پیرۆزبێ ژینی تازە و نوێتان،

ژینی خۆشبەختی و کامەرانیتان

پیرۆزبێ لێتان، پیرۆزبێ لێتان،

کەژاوەی شادی و بەختەوەریتان.

* * *

پیرۆزبێ لەبووك، پیرۆز لەزاوا

بەهاری تازەو بەگوڵ ڕازاوە.

**Hewler-2006**

# بۆ شۆخێکی شار

تۆزێ لەچکەکەت لادە،
ڕەنجی چاو بەبا مەدە..
ئەو ڕووەی چاو بۆی وێڵە
والآیکە..، حەشار مەدە

بەدبین نیمە مەترسە،
دڵنیابە..دڵنیا
تەنیا پرسیاری ڕووتم،
پرسیاری ڕووتە تەنیا
***

هێندە ڕێگەم پێ مەبڕە،
دەمێکە بەدوات کەوتووم
دەمەوێ ڕووت ببینم، مەرەق دڵی خواردووم

بابزانم، جوانی ڕووت گیانە لەکێ دەکا
چونکە بەژن و باڵای تۆ
لەیاری پێشووم دەکا !

ئەو یارەی ڕووی وەك گوڵ بوو
بەڵام..گوڵی کەمێ ئاڵ
کەخوا تێیدا چنیبوو بۆ سووتانم وردە خاڵ!

ئەگەر ڕووی تۆش وەك ئەوە
دڵنیام کە..تا زووە
با نەسووتێم بەو ڕووەی نیوەی عومرم پێ چووە.

**9-nov-2006**
**Hewler**

* * *

پێش خاڵی تۆ، چەندین ساڵان
جوانی خۆم ناشت لەڕێی خاڵان
کەچی خـــاڵیش بوون بەپشکۆ
لەچوار چێـــوەی دڵـم ئاڵان.

* * *

## تۆ وابكە ...

كە سێبەری درەختێك بی،
لەسەر ڕێگەی ماندووبوونم
شیلەی لێوی كانیێك بی،
لەلێواری تێنووبوونم

تا خۆشاوی خۆشەویستیت
داچۆڕێنمە ناوخوێنمەوە..
نەرمە نەرمە داتپڕژێنمە
سەر ئێسقان و بن پێستمەوە..

***

تاكو نەڵێم:"ئاسمانێك بووم،
هەور جوانی لێ تۆراندم
باخی دڵی زەمینێك بووم،
پایز گوڵی لێ وەراندم"

تاكو نەڵێم:
"چوومە ژوانی
ئێوارەیەك بەجێی هێشتم،
لەبناری تاریكی شەو
وەك زەردەپەڕ باڵای ناشتم"

ئەستێرەكی گەشاوەبە،
تا سپێدەش تۆی خۆشبووێ..
بەهارێكی ڕازاوەبە،
تا بارانیش تۆی خۆشبووێ..

***

تۆ وابكه..، لەلاپەڕە

خەماوییەكان نەتناسمەوە..

لەگەڵ هاژەی هیچ ڕووبارێك

توڕەبوونت نەبیستمەوە ..

داستانێك بی،

خۆشەویستی

نەفرەت نەكا لەهەبوونت

كوژانەوە، قەد نەبێتە

بەسەرهاتی ئاوابوونت.

Hewler-2006

# لەدەرگە دان

کچی سروشت،
دەستکردی خوا،
چەند لەجوانی لێ وەشاوی ـ
هێندە لەنێو جوانیت ونم،
بەسەرسام و سەر سوڕماوی.

***

وەك كازێوەو دەمی زەرد بوون

بەڵگە نامەی "جوانی تاکە" .

کە ڕوومەتت وەك خۆر هەڵبوون،

پرشنگ جاڕ و وا ڕووناکە

کەلێوانت . ڕەنگێکی تر ناشێ بۆیان،

وەکو خۆیان

کەچاوانت . مەگەر بەس خۆت

پێناسەکت هەبێ بۆیان!

***

شەوگارێکە،

لەئاسمانا، تۆ تروسکەی کامەرانی

ڕوژگارێکە،

لەزەمینما، تۆ ڕووپۆشی نیگەرانی

بۆیە هاتووم لەدەرگەت دەم

وشە چبیٚ، ئێرەو ئەوێی -

بۆ نەگەڕێم، بۆت نەنووسم

تەنیا بڵێم: خۆشم دەوێی.

***

خۆشم دەوێی، بەقەد باخ و

بەقەد گوڵی نەوبەهارا

خۆشم دەوێی، بەقەد شاخ و

بەقەد شنەبای کۆسارا

خۆشم دەوێی، بەقەد جەنگەڵ #

بەقەد سیمای دارو بارا

خۆشم دەوێی،

بەقەد شەپەی شەپۆڵەکان بۆ کەنارا.

Hewler-2005

---

# جەنگەڵ: دارستانی چڕ.

شەوێك دیاركە بۆ ڕاموسان

تاشەرم و شـێ لەڕوو لاچن

ئاگـری ناخمان بكوژێیننەوە

ئەو لێـوانەی وەفدی ماچن.

## پەنام بدە..

ئەو دڵەی کە بۆ تۆ شێتە، مەیڕەنجێنە
ئەو چاوەی کە تینووی ڕووتە، مەیگرێنە
کەنازانی خەم بۆ ئاشق چەند بەئێشە
لەخاکێکدا ئاشق لێی بیٚ، خەم مەچێنە.

پەنام بدە، خامە نەخشی خەیاڵم تۆی
پەنام بدە، هیوا بەخشی ژیانم تۆی.
***

دڵ ڕەق مەبە، لانەی حەزم وێران مەکە

بۆم خەم مەبە، چاوم دیلی گریان مەکە

کەنازانی گڕی ئەشق چ گڕێکە

بێباك مەبە، من قوربانی سووتان مەکە.

پەنام بدە، خامە نەخشی خەیاڵم تۆی

پەنام بدە، هیوا بەخشی ژیانم تۆی.

***

گوڵم، گوڵی جوانیم لێ مەچەمێنەوە

چرای عومری داگیرساوم مەکوژێنەوە

تۆ نازانی زام هەوێنی چ ژانێکە

پەنام بدە، با لەزاما نەتوێمەوە.

پەنام بدە، خامە نەخشی خەیاڵم تۆی

پەنام بدە، هیوا بەخشی ژیانم تۆی.

**23-9-2006**
**Hewler**

## مەستی

سـەر گەرمە ئەمشەو ساردە خەیاڵی
لەزیـکری یـــاری نیشتووم لەپاڵی
دەڵێی مـوریـــدی سەنعــانی شێخە
لەزیـکری یـــاردا مەستـتر دەناڵی

چــاو مەلی مەستە ناترووکێ باڵی
لەسـەیری چــاو و ڕوومەت و خاڵی
ئاسمـانە وێڵــە لە تــەم, بەباران
تەمی پێش بینـایی خـۆی ڕادەماڵی

لێــو کـۆرپەی کپــە لە گـڕ و گاڵی
لەناو لانـــکی ســـەر سنـگی ئاڵی
شێـوەی تینووێکی تووشهاتووی ئاوە
تینووی دەشکێنێ خۆش مەستە حاڵی.



127

## گفتوگۆ

- کێ هێندەی تۆ، لەزمانی دڵم دەگا؟
لەئەڤین و ڕەنگ و واتای گوڵم دەگا؟
+ کێ هێندەی من، ئاوێتەتە لەم دونیایە؟
کێ بەقەد من، بۆ تۆ ئەشقی لەدڵدایە؟
***

- خۆشەویستم:

نییە وەك تۆ منی بویٚ، ئەوم بویٚ

+ خۆشەویستم:

نییە وەك تۆش خۆشی بوێم، خۆشم بویٚ.

- تۆ هۆنراوەی"مانگی ڕوونی" لەئاسمانی،

ئەستێرەکان،

دەتخوێننەوە بەگۆرانی

+ تۆش هەر خۆتی و

شای جوانی ئەم گەردوونەی

هەوێنی ئەم خۆشەویستی یە بیٚ نموونەی

- ئەڤینی تۆ:

بەفر نییە، بەتیشکی خۆر بتوێتەوە

+ ئەڤینی تۆش:

چرا نییە، بەفووی دەمێك بکوژێتەوە.

***

ئێمە هەردووك،

دوو ڕێبوارین

هەنگاو دەنێین لەیەك ڕێگە،

دوو پەیامی دڵمان پێیە

هەگبەی حەزمان ڕەنگا و ڕەنگە

بارانین،

خاكی ووشك و

بەردەلاٌنبووی یەك ئاوڕێژ دەكەین

بەهارین،

باخی كز و

زەردەلاٌنبووی یەك گوڵ ڕێژ دەكەین.

Hewler-2006

## نامەیەک بۆ وەرزێک

وەرزە کزەکەی
دوێنێم بەسەرچوو، ئەمڕۆ گۆڕاوم
تازە چرۆمە،
ئەو خونچە گوڵ نیم، کە پێت لێناوم.

**16-12-2006**
**Hewler**

## ئێــش

لەوەتەی من
ڕێگەی ژوانی خۆم گۆڕیوە
دڵ تائێستا
ئەوەی ئێش بێ نەیبینیوە

جارێك نەبێ
سەرم چاڵی بۆ هەڵکەنیم
دڵیش بۆ ئێش تێی کەوتەوە
ئەویش شەوێك
لەباوەشی چاو ڕەشێکدا
چاو ڕەشێکم بیرکەوتەوە.

**Hewler-2006**

## بۆ شیعرێ

## کەنەمنووسی!

نیوە شەوێك گووتم: دەبێ -

بۆ ئەم خاڵەی لەڕووخسارتا

شیعرێ بچنم وەك گوڵ ناسك،

نەتبیستبێ لەژیانتا ..!

دەیان ئاواز بۆی دانەوێن
لەگەڵیـــاندا ژوان ببەستی
دەیان دڵدار بینووسنەوە
لەشانامەی خۆشەویستی

بەڵام..وەك گڕ
ترسێك هات و لەپەنجەم نیشت
گووتی: نەكەی -
لەپێناوی تاكەخاڵێك
سەد نهێنی ئاشكراكەی.

2-12-2006
Hewler

# مزگێنی

ئەو تاقانەی دڵی پێکام،
دڵ پەرستیم  هەر بۆ ئەوە..!
لەهەر باوشێك خۆم ببینم،
خۆشەویستیم  هەر بۆ ئەوە..!

بەلێوی ئەو، ئاوی دەم و
ماچی لێوان دەخۆمەوە!
بەماچی ئەو، جێ سووراوی
سەر ڕوومەتم دەشۆمەوە!

Hewler-2006

# ناوەڕۆک

## ناڵەی بەفر و پشکۆی ئاگر

### کۆمەڵە شیعری

**2006 ـ 2005**

Hiwa_seid@hotmail.com